زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەڵقەی یەکەم



عەلی باپیر

# گەنجەکانمان

## لە نێوان

## ڕەسەنایەتی و لاسایی کردنەوەدا



# گەنجەکانمان
# لە نێوان
# ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا

عەلی باپیر

1427 ك 2006 ز



# پێشكەش بێ

بەو گەنج و تازە پێگەیشتوانەی لە سایەی ئیمان بە خواو متمانە بە خۆبوونەوە ڕەسەنایەتی ئیسلامیی و نەتەوەیی خۆیانیان پاراستوە و گیرۆدەی دەردی لاسایی كردنەوەی كوێرانە نەبوون!

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى، وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَ مِن دُونِهِ إِلَهًا لَقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا﴾ الكهف -14،13-

# ئەم نامیلكـەیە

ئەم نامیلكەیە لە ئەسڵدا - بێجگە لە پێشەكی یە كەی- وتارێكە كە مانگی (5) ی (2006) لە (هۆڵی پێنجی ئازار) لەشاری (ڕانیە) لە كۆڕێك دا پێشكەش كراوە بە ناوونیشانی: ﴿**گەنجەكانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی كردنەوەدا**﴾ پاشان (محمد) ی كوڕم لەسەر كا سێتەوە هێناویە تە سەر كا غەز و (عبدالرحمن)یش تایپی كردوە، خوا سەلامەت وسەربەرزی دونیاو دوارِۆژیان بكات. دواییش بۆخۆم پێیدا چووەمەتەوە و پێ شەكی یەكم بۆ نووسیوە و سەرەنجام بەم جۆرەی لێ هاتوە.
شایانی باسیشە ئەم نامیلكەیە لەم پێنج خاڵە پێكهاتوە:

**یەكەم: پێناسەی گەنج و ڕەسەنایەتی و لاسایی كردنەوە:**
كە بە كورتی و پوختی پێنا سەی هەركام لە ( گەنج) و (ڕەسەنایەتی) و (لاسایی كرنەوە) م كردوە.

**دووەم:** لەم خاڵی دووەمەدا ڕوو نمان كردۆ تەوە كە قۆ ناغی گەنجێتی لە تە مەنی مرۆ ڤدا قۆ ناغێكی زۆر گرنگ و هەستیارە و قۆناغی تێدا بنیات نرانی كەسایەتیی یە، هەر جۆرە كەسایەتیی (شخصیة) یەك، وە وەك بناغە وا یە بۆ قۆناغەكانی دیكەی تەمەن و ژیانی ئینسان.

**سێیەم: ڕەسەنایەتیی و بەهرە لە خەڵك وەرگرتن دوو شتی دژو پێچەوانەی یەکدی نین:**

لەم خاڵی سێیەمەشدا ئەو ڕاستییەمان ڕوون کردۆتەوە کە ڕەسەنایەتیی (أصالة) نەك هیچ ناکۆکی و دژایەتی یەکی لەگەڵ بەهرە لە خەڵك وەرگرتن نیە، بەڵکو تەواو کەری یەکدین شن و ڕەسەنایەتی داخوازی ئەوە دەکات کە بابای ڕەسەن (أصیل) یان میللەتی ڕەسەن هەوڵ بدات هەر خێر و چاکەیەکی دیکە کە لە لای خەڵکی هەیە و بۆ خۆی نیەتی وەدەستی بێ نێ و لە ڕووی سود و بەهرەمەندبوونەوە بیخاتە گەڵ ئەو خێر و چاکانەی کە هەینی و پارێز گاریی لێ یان کردوە، وە بە هیچ جۆر ێك: (پارێزگاریی لە چاکە و خێری خۆ کردن) ڕێگری (چاکە و خ ێری خەڵکی دیکە وەدەست خستن) نیە!

**چوارەم: دیاردەی لاسایی‌کردنەوە لە چی یەوە سەرچاوە دەگرێ و هۆکارەکانی تەشەنە کردنی چین؟!**

لەم خاڵەش دا تیشکمان خستۆتە سەر ماك و میکرۆب و هۆی سەرهەڵدانی دیاردەی لاسایی کردنەوە و پاشان هۆکارەکانی پەرە ستاندن و تەشەنە کرد نی ئەو نەخۆ شی یە فیکر یی و دەروونیی و کۆمەڵایەتی یە لە نێو بەشێك لە گەنج و لاوەکانماندا

بەهەردووك ڕەگەزیانەوە و، سەرجەم هۆکارەکانی تە شەنەکردنی ئەو نەخۆشی یەمان لە نێو کۆمەڵگاکەمان دا بۆ سێ شتان گێڕاوەتەوە:

1. هەبوونی لاسایی کردنەوە لە ئاستی سەرەوەی سەرکردایەتی فیکریی و سیاسی دا.
2. کاریگەریی خراپی هۆیەکانی ڕاگەیاندنی لایەنە لائیکەکان.
3. هەبوونی بۆشایی فیکریی و ڕووحی لە نێو چینی گەنج و لاودا.

**پێنجەم: چارەسەری نەخۆشی لا سایی کرد نەوە لە چی دا دەبینین؟!**

لەم خاڵی پێنجەمیش دا باسی چۆنیەتی چارە سەر کرد نی ئەو نەخۆشی یەمان کردوە و لە سێ بڕگان دا خستوومانەتە ڕوو:

**یەك:** پەی بردن بەو ڕاستی یە کە فیکر و کلتوور (ثقافة) ی هەر گەل وکۆمەڵگایەك هەڵقوڵاوی د ین و عەق یدەو جیهان بینـــی یەتی، بۆیە بانگەشەکردن بەهەموو شێوەیەك بۆ وەرگرتنی فیکرو کلتووری گەل و کۆمەڵگایەك کە د ین و عەقیدە و جیهانبینیی لە هی ئێمە جیایە بێ ئەوەی مافی لە بێژین گدان و هەڵ سەنگاندن و پاك و پیس ل یێك

هەڵاواردنی بە خۆمان بدەین، و ڕێڕای نا شەرعیی و گوناهباریی، نامەنتیقی و عەیبداریشە!

**دوو:** باوەڕ و متمانە هەبوون بە ڕەسەنایەتی خۆ، چونكە بابایەك خۆی پێ پووچ و بێ ڕیشە و بێ ئەسڵ و فەسڵ بێ وەك پووش و پەڵاش و قانگەلۆشك بەدەم هەر پشوە بایەكەوە دەچێ!

**سێ:** بنبڕ كردنی ئەو قەیران و كێشەو گرفتانەی كە پشوویان بە خەڵكەكەمان بە گشتی و بە تایبەت بە چینی گەنج سوار كردوە و یەكجار پەست و بێزاری كردوون. ئەو كێشەو قەیرانانەی كە هێندە زۆر و جۆراو جۆرن ئەستەمە بگونجێ بخرێنە ژێر پێناسە و ناوونیشانێكی دیاری كراوەوە، چونكە سەرجەم بوارەكانی: فیكر و عەقیدە و ئەخلاق و خێزان و حوكم و سیاسەت و دادوەریی و ئابووریی و ئاساییش و.... هتد یان گرتۆتەوە!

هیواداریشم ئەم نامیلكەیە ببێتە هۆی بەر چاو ڕوونیی ژمارەیەكی زۆر لە گەنج و تازە پێگەیشتووەكانمان و ڕەسەنایەتیی ڕەسەنەكان زیاتر و پتەوتر بكات و بۆ ئەوانەی دیكەش مایەی چارەسەر بێت.

# پێشــەكی

لە واقیعی ئەمڕۆی كورد ستان دا چینی گەنج و تازە پێگەیشتوومان بەگشتیی لە قەیرانێكی فیكر یی و ڕوو حی و ئەخلاقیی دا دەژی، لە سۆنگەی ئەو ڕێڕەوە هەڵەیەدا كە گرووپە سیكۆلاریستەكان گرتوویانەتە بەرو لە سیاسەت و ڕاگەیا ندنیان دا ڕەنگ دەداتەوە، كە بریتیە لە: (حا شاكردن لە ئی سلام و مسوڵمانەتیی و هەرشتێك كە بە سەرەداوێك دەچێتەوە سەریان و بە هەموو ه یز و توا ناوە ڕوو وەرگ یڕان و وەر سوڕان بەرەو سیكۆلاریزم لە هەموو بوارەكانی ژیان و گوزەران دا و لا سایی كردنەوە و چاو لێكردنی هەرچی زیاتری ڕۆژئاوا)!!

جا شایانی باسە ئەو ڕێڕەو(ا تجاه)ەی سیكۆلاریزم ز یاتر كەسانێك لە پشتییەوەن و ئاڕا ستە (توج یه) ی دە كەن كە: تاڕاددەیەكی زۆر لە ئی سلام نە شارەزا و بێ ئا گان و بۆ گرە هەندێكیان بیجگە لە قسەو ڕەخنەی دوژمن و ناحەزانی ئی سلام شتێكی دیكەی لە بارەوە نازانن و بە مانای وشە لەو بارەوە بە نەخوێندەوار (أمي) لە قەڵەم دەدرێن و سەرەنجام پەندی (ال ناس اعداء ما جهلوا) - خەڵكی دوژمنی شتێكن كە نایزانن - یان بەسەردا چەسپیوە!

هۆی ئەو نە شارەزایی و بێ ئا گایی یەی ئەو جۆرە کەسانەش لە ئیسلام - کە هەر چۆن بێ ئایین و بەرنامەی گەل و کۆمەڵگاکەیانە و بۆتە بەشێکی هەرە گرنگ گەورەی مێژوو و ڕابردووی و هەوێن و هەناوی فیکر و فەرهەنگ و ئەدەب و کلتووری[1] - بە ڕای من ئەم چوار هۆکارەن:

**یەکەم:** پێگەیشتن و گەورە بوونیان لە جوغزیی واقیع و هەل و مەرجێکی دوور لە ئیسلام و مسوڵمانەتیی بە تایبەت ئەوانەیان کە ماوەیەکی زۆری ژیانیان لە ڕۆژئاوا بردۆتە سەر.

**دووەم:** هەر لە سەرەتاوە گیرۆدە بوون بە ڕەشبینی و نائومێدیی بەرامبەر بە ئیسلام و نەبوونی پاڵنەر و هاندەر بۆ هەوڵدان بۆ لێ تێگەیشتنی قورئان وسوننەت دوو سەرچاوەی ڕوون و بێ چەند و چوونی ئیسلام.

**سێیەم:** قیاس کردنی ئیسلام لەسەر واقیع و حاڵی شپرز و بەجێماوی مسوڵمانان و بە هەڵە واحاڵی بوون کە:

بارودۆخی وا شپرز و بێ سەرو بەری مسوڵمانان ڕەنگدانەوەی ئیسلامەو لەمەوە گەیشتنە ئەو ئەنجامگیریی یە

[1] کەواتە دەبوایە ئەگەر ئیمانیشیان پێی نەبێ هەر هەوڵیان دابایە شارەزای بن.

كە: مادام مسوڵمانان بەهۆی شوێن كەوتنی دینەكەیانەوە بەو دەردە چوون، كەواتە دیارە دینەكەیان لە خودی خۆی دا ناتەواو و هەڵەیە! بەڵام بێگومان ئەو جۆرە بیر كردنەوە و ئەو قیاس كردنە لە بنەڕەتەوە هەڵەیە چونكە كاتێك واقیع و حاڵی كۆ مەڵێك دەكرێتە بەڵگەی ڕاستیی یان ناڕاستیی بەرنامەو ڕێبازەكەیان كە بە بەرنامە و ڕێبازەكەیانەوە پابەند بن و پەیڕەویی لێ بكەن و ئەو چی دەڵێ وابكەن، بەڵام لە كاتێك دا پێیەوە پابەند نەبن و بگرە ئەو چی گوتوە ئەوان پێ چەوانەكەی بكەن، ناگونجێ واقیعەكەیان بكرێتە بەڵگە لەسەر بەرنامە و ڕێبازەكەیان، ئا یا پزیشكێك كە جگەرە دەكێشێ و شەڕاب دەخواتەوە دەكرێ ئەو ڕەفتارەی بكەینە بەڵگە لەسەر ناڕاستیی و بە كەڵك نەهاتوویی زانستی پزیشكی؟!

بێگومان نەخێر، دەجا بە هەمان شێوەش كاتێك ئیسلام فەرمان بە مسوڵمانان دەكات كەپێكەوە براو تەبا و یەكڕیز بن: ﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ﴾ آل عمران -103-، وە دادگەریی بچەسپێنن و دژی ستەم بن: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ﴾ النساء -135-،... هتد. بەڵام ئەوان بە پێچەوانەوە ڕەفتار دەكەن و لە ئیسلام لادەدەن، بێگومان

خەتا لە ملی خۆیانە نەك دینەكەیان!!

**چوارەم:** قیاس كردنی ئیسلام لەسەر نەصرانییەتی ڕۆژئاوا كە كاتی خۆی بە دەستی كەنیسە و چینی ئەكلیرۆس و قەشەو پاپایەكانەوە بوو بووە مۆتەكەو ملۆزم بۆ خەڵك و جەماوەرو كۆسپ و لەمپەرێكی بێڕەزا بوو لەبەردەم گۆڕان و گەشە كردنی ژیان و گوزەران و مافو ئازادییەكانی خەڵك و جەماوەردا، هەر بۆیەش گەلێك جار گوێ بیستی هەندێك لە نووسەر و ڕۆشنبیرە سیكۆلاریستەكان دەبین دەڵێن:

ڕۆژئاوا كاتێك ژیانی گۆڕا و بەرەو پێش چوو و گەشەی كرد كە دەست بەرداری (دین) بوو، ئەگەر ئێمەش دەمانەوێ بگۆڕێین و بەرەو پێش بچین دەبێ وەك وان بكەین و دینەكەمان توور بدەین!!

بێ خەبەر لەوە كە (ئیسلام)ی ئێمەی موسوڵمان هێندەی ئاسمان و ڕێسمان لە (نەصرانییەت)[2] ی ئەوان دوور و جیاوازە،

---

[2] دیارە بەرنامەكانی خوا كە بەرنامەی عیسای مەسیحیش (علیە السلام) یەكێكیان بووە لە خودی خۆیاندا هەموویان ڕاست و تەواون، بەڵام دوایی هەموویان دەستكاری كراون و گۆڕاون جگە لە ئیسلام، چونكە ئیسلام دوایین بەرنامەی خوایە و بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیش نێرراوە بۆیە خوای كاربەجێ لە گۆڕان و دەستكاری كرانی پاراستوە، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر -9-، واتە: ئێمە خۆمان قورئانمان ناردۆتە خوارێ و هەر خۆشمان پارێزەرینی.

جا ئێمە بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستی یە دەتوانین دوو جۆرە بەڵگان بێنینەوە:

**یەکەم:** واقیع و مێژووی مسوڵمانان و خەڵکی وڵاتانی ڕۆژئاوا کە ڕاستەو ڕاست پێچەوانە و بەراوەژووی یەکدین!

چونکە ئەوان هەتا پەیرەویی یان لە ئایینە شێوێنراو و گۆڕاوەکەیان دەکرد بەجێماو و شپرز بوون و کاتێك دەستبەرداری بوون، لەو حاڵەی پێشوویان قوتار و دەرباز بوون -بە تایبەت لە بواری ژیان و گوزەرانی ماددی دا-.

بەڵام ئێمەی مسوڵمان بە پێچەوانەوە: هەتا دەستگرتوو بووین بە ئیسلامەوەو کەم و زۆر پەیڕەویی مان لە قورئان دەکرد، نەك هەر لە پێش خەڵکەوە بووین بەڵکو سەرقافڵەی کاروانی ژیان و شارستانێتی بووین لەسەر ئاستی دنیا و هەموو بوارەکانی: زانست ودادگەریی وچاکەکاریی و ئازادیی و سەماحەت و...هتد دا سەرمەشق بووین، بەڵام کاتێك لە ئیسلام دوور کەوتینەوەو بە ئیسلام نامۆ بووین، گلۆڵەمان کەوتە لێژی! ئەمەش ڕاستییەکی مێژوویی یە کە پێش مێژووزانە مسوڵمانەکان مێژوونووسانی نامسوڵمانی وەك: دڕاپیەر و جۆلستهێر و ئادەم میتز و کارل بڕۆکلمان، دانیان پێدا هێناوە.

**دووەم:** چەند دەقی قورئان و سوننەت كە بە ڕا شكاوی فەرمان دەكەن بە هەموو ئەو شتانەی دەبنە ما یەی بەخ تەوەریی تاك و كۆمەڵ و بەرەو پێش چوون و گە شەكردنی ژ یان و گوزەران، بۆ نموونە ئەمانە چەند دەقێ كی قور ئانن لەو بارەوە:

**یەك :** لە بارەی بیر كرد نەوەو بەكارهێنانی عەق ڵەوە بۆ دۆزینەوەی نهێنیەكانی بوونەوەر:

1- ﴿**أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللّهُ مِن شَيْءٍ**﴾ الأعراف -185-، وا تە: ئەوە سەرنجیان نەداوە تە مولكی ئاسما نەكان و زەوی و هەرشتێك كە خوا دروستی كردوە!

2- ﴿**فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ**﴾ الطارق -5-، واتە: دە با مرۆڤ تەماشا بكات لە چی دروست كراوە!

3- ﴿**فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ**﴾ عبس -24-،

واتە: دە با مرۆڤ بڕوانێتە خواردنەكەی.

**دوو :** لە بارەی ڕێزگرتنی تایبەتەوە لە زانا و پسپۆڕان:

1- ﴿**يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ**﴾ المجادلة -11-

واتە: خوا ئەوانەتان كە ئیمانیان هێناوە بەرزیان دەكاتەوە و ئەوانەش كە زانیاریی یان پێدراوە چەندان پلە (بەرزیان دەكاتەوە).

2- ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ﴾ الزمر -9-، واتە: بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن یەكسانن؟ بێگومان تەنها خاوەن عەقڵان بیر دەكەنەوە و پەند وەردەگرن.

3- ﴿فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ النحل -43-، واتە: دە جا لە زانایان بپرسن ئەگەر نازانن.

**سێ:** لە بارەی چەسپاندنی دادگەرییەوە لە هەموو بوارەكانی ژیاندا:

1- ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَ الْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ..﴾ الحديد -25-، واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگەوە ناردوە و كتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوون تاكو خەڵكی بە دادگەریی بەڕێوە بچن.

2- ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى..﴾ الأنعام -152-، واتە: وە ئەگەر قسەتان كرد با بابای قسە لەسەر كراو

خزمیش بێ، دادگەربن.

3- ﴿..وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾ الشورى -15-، واتە: وە فەرمانم پێكراوە كە دادگەرییتان لە نێواندا بكەم.

4- ﴿لاتَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ﴾ البقرة -279-، واتە: نە ستەم بكەن و نە ستەمیش قبووڵ بكەن.

5- ﴿..وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ المائدة -8-، واتە: با ڕق بوونتان لە كۆمەڵێك واتان لێ نەكات كە دادگەر نەبن، دادگەر بن ئەوە لە پارێزكاریی یەوە نزیكترە.

**چوارەم:** لە بارەی كار و بار بەڕێوە بردنی وڵات سپاردنی بە خەڵكی شایستە و حوكم كردن لە نێوان خەڵكی دا بە شێوەیەكی دادگەرانە و كارو بار بەڕێوە بردن لەسەر بناغەی ڕاوێژ:

1- ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ..﴾ النساء -58-، واتە: خوا بە تەئكیید فەرمانتان پێ دەكات كە سپاردەكان بە خەڵكی شایستەی خۆیان بسپێرن، وە هەر كات حوكمتان كرد بە دادگەریی حوكم بكەن.

2- ﴿..وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ الشورى -38-،

واتە: وە ئەوانەی وەڵامی پەروەردگاریان داوەتەوە و نوێژیان بەرپا کردوە و کار و باریان بە ڕاوێژە لە نێو خۆیاندا و لەوەی پێمان داون دەبەخشن.

3- ﴿..وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ..﴾ آل عمران -159-، واتە: وە لە کار و بار بەڕێوە بردن دا ڕاوێژیان پێ بکە.

کەواتە:

ئایا دەگونجێ ئیسلامێکی ئاوا کە فەرمان دەکات بە بەکارهێنانی عەقڵ و هۆش بۆ دۆزینەوە و پەی پێ بردنی نهێنی یەکانی بوونەوەر و یاساکان (سُنَن)ی خوا سبحانه وتعالی کە کارو باری کائیناتیان پێ بەڕێوە دەبات و، فەرمان دەکات بۆ گەڕانەوە بۆ لای زانا و پسپۆڕان و شارەزایان لە هەموو بوارەکان دا و، بە ڕاشکاوی ڕایدەگەیەنێ کە خوای گەورە ڕێزی تایبەتی لە زانایان دەگرێ بە چەندان پلە بەسەر خەڵکی دیکە دا بەرزیان دەکاتەوە و، ڕوونی دەکاتەوە کە خوا جلّ شأنه تێ ھکرای پێغەمبەرانی خۆی (علیهم الصلاة والسلام) بۆ ئەوە بە کتێب و تەرازووەوە ڕەوانە کردوە کە خەڵکی بە دادگەریی بەڕێوە بچن و

دادگەریی لە ژیانیان دا بچەسپێنن لە هەموو بوارەکان دا و تەنانەت لەگەڵ دوژمن و ناحەزانیشیان دا و، فەرمانیان پێ دەکات کە ئەمانەتی بەرپرسێتی و کارو باری وڵات بەڕێوە بردن بە خەڵکی شایستە بسپێرن و، هەموو ئیش و کارێکیان لەسەرجەم بوارەکانی ژیان و گوزەرانی دینداریی و دنیا داریی یان دا لەسەر بناغەی ڕاوێژ (شوری) بەڕێوە بەرن و...هتد.

بەڵێ ئایا ئیسلامێکی ئاوا دەگونجێ بوویێت و ببێتە مایەی بە جێمان و حاڵ تێکچوونی مسوڵمانان، وەك چۆن کاتی خۆی ئایینی تێکدراو و شێوێنراوی مەسیح علیە السلام خەڵکی ئەوروپا و ڕۆژئاوای دووچاری بە جێمان و ماڵوێرانی کردبوو، لە سۆنگەی ئەوەوە کە لەگەڵ نەزانیی (جَهل) و دژی زانست بوو، پشتگیریی زوڵم و ستەمی ئابووریی و سیاسی و کۆمەڵاتیی دەکرد و دژی ئازادیی و مافەکانی خەڵك و جەماوەر بوو و، لایەنگیریی حوکمی تاکیی و دیکتاتۆریی دەکرد و دژی حیساب بۆ ڕاو ئیرادەی جەماوەر کردن بوو...هتد؟!

بێگومان نەخێر، چونکە وەك تۆزێك تیشکمان خستە سەر ئیسلام و نەصرانییەت وەك دەڵێن: هەرخوایان یەکە و یەکجار لە یەك دوور و جیاوازن، ئەوەش کە هەرکام لە ئیسلام و

مەسیحییەت یان (قورئان) و (ئینجیل) لەئەسڵدا لە لایەن خوای کاربەجێوە هاتوون ناگونجێ بکرێتە بەڵگەی وەك یەك بوون و لە یەك چوونیان، ئا یا دە کرێ ب لێین: هەرکام لە سیستەمی حوکمڕانیی دیموکڕاسیی و سیستەمی حوکمڕانیی دیکتاتۆریی وەك یەکن چونکە هەردووکیان زادەو بەر هەمی بیر و هۆ شی مرۆڤن؟! بێگومان نەخێر، دەجا ئیسلام و نەصڕانییەتیش بە هەمان شێوە لە ئەصڵدا ئاسمانیی بوون و لە لایەن خواوە هاتنیان بەڵگەی وەك یەك بوون و یەکسان بوون بگرە لە یەکچوونیشیان نییە، چونکە:

**یەك:** ئینجیل و بەرنامەکەی (عیسى) علیه السلام هەر لە ئەسڵیش دا بۆ گەل و کۆ مەڵگا و قۆناغێکی تایبەت و دیاری کراو نێررابوو، کەگەل و کۆمەڵگای (بنی إسرائیل)ە لە قۆناغی پێش ڕەوانەکرانی (محمد) پێغەمبەریکۆتایی دا صلى الله علیه و سلم، وەك خوا تبارك وتعالى لەو بارەوە فەرمویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم... ﴾ الصف-6-

واتە: وە کاتێك عیسای کوڕی مەریەم گوتی: ئەی وەچەی[3] ئیسرائیل من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە..

کەواتە:

شتێکی ئاسایی یە کە ئایین و بەرنامەی عیسا (علیە الصلاة والسلام) بێجگە لە نەتەوەی ئیسرائیل وئەو قۆناغ و هەل و مەرجە کەتێیدا ژیاون، بۆ خەڵك و قۆناغێکی دیکە نەگوجێ، وەك لە واقیعیش دانەگونجاوە و ناشگونجێ!

**دوو:** ئەنجا سەربارەی ئەوەش (ئینجیل) وە ئایینەکەی عیسا علیە السلام پاش خۆی گۆڕاو دەستکاریش کرا وەك سەرجەم مێژوونووسان دەزانن و دانیان پێدا هێناوە و خوای زانا و پەنهانبینیش هەواڵی پێداوین و فەرموویەتی: ﴿ **وَمِنَ الَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ...**﴾ المائدة -14- واتە: وە ئەوانەی گوتیان: ئێمە نەصرانین پەیمانێکی پتەومان وەرگرت - کە دینداریی ڕاستەقینە بکەن- کە چی بە شێکیان لەوەی کە پێی

[3] (إسرائيل) نازناوی (يعقوب) پێغەمبەرە صلى الله علیە و سلم کەواتە: (بني إسرائيل) یانی وەچە و نەتەوەیەك کە لە (يعقوب) پەیدا بوونە.

ڕاسپێررابوون فەرامۆش كرد و پشت گوێ خست...

بۆیە ئەگەر پێشتر كتێب و بەنامەكەی عیسا علیە السلام لەبەر تایبەت بوونی بە كات و شوێن و كۆمەڵگا یەكی دیاریكراوەوە، بۆ ڕێكخستنی ژیان و گوزەرانی خەڵكی دی كە نەدەگونجا، ئەو جارە هۆكارێكی دیكەش سەری هەڵدا بۆ زیاتر نەگونجانی كە بریتیە لە گۆڕان و شێوێنرانی[4]!

بەڵام قورئان و ئیسلامی (محمد) صلی الله علیە و سلم بە پێچەوانەوە: هەم لە ئەسڵدا بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیی نێرراوە بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین، وەك خوای كاربەجێ فەرموویەتی:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً﴾ سبأ -28-.

واتە: وە تۆمان ڕەوانە كردوە مەگەر بۆ تێكڕای خەڵكی مژدەدەر و ترسێنەر بی..

[4] هەر لێرەشەوە دەزانین ئەو كوردانەی گوایە بە دوای هیدایەت دا دەگەڕێن و دەبنە نەصرانیی چەند داماو و بەجێماو و هەڵخەڵەتاون كە دەكەونە شوێن دینێكی لە ئەسڵ دا بۆ ئێستاو ئێمە نەهاتووی گۆڕراو و هیچ بەسەر هیچەوە نەماو! ئەمە ئەگەر بەدوای (دین) دا بگەڕێن، بەڵام ئەگەر عەودالی ژیبن بن ئەوە دیارە شتێكیان چنگ دەكەوێ، بەڵام بێگومان زۆر كەمتر و گچكەترە لە ئابڕوو چوونی دنیا و دوارۆژ !!

هەروەها فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾ الأعراف-158- واتە: ئەی موحەممەد! بڵێ: ئەی خەڵکینە! من ڕەوانە کراوی خوام بۆ لاتان بە تێکڕایی...

وەهەم خوای باڵادەست پاراستوو شیەتی لە گۆڕران و دەستکاری کران وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر -9-، هەر بۆیەش زۆر شتێکی ئا سایی و مەنتیقی و چاوەڕوان کراوە کە قورئان و ئیسلامی لە گۆڕران و دەستکاری کران پارێزراو بۆ سەرجەم بە شەر نێرراوە بتوانێ وەلامگۆی هەموو پرسیارەکانی ژیان و گوزەرانی مرۆڤ بێت و چارەسەری تێڕای گرفت وکێشەکانی بکات!

ئێستاش کە هەتا ڕاددەیەك تیشکمان خستەسەر هۆکارەکانی بێئاگایی و نەشارەزایی ئەو گروپ و تاقمە سیکۆلاریستانەی گەنجەکانمان بەرەو بێ دینایەتی و لاسایی کردنەوەی کوێرانەی بێگانەو نەیارانی دین دەبەن، دەربارەی ئیسلام و، ڕوونیشمان کردەوە کە ڕەشبینیی یەکەیان بەرانبەر بە ئیسلام جگەلە نەزانین و بێ ئاگایی هیچ بەڵگە و پاساوێکی دیکەی نییە، بە ئاراستە کردنی چەند پرسیارێك کۆتایی بەم پێشەکی یە دێنین:

1- ئایا تاوانێكی یەكجار گەورە نییە كە لەژێر هەر پەردەیەكەوە بێ و بە بیانووی بەرەو پێش بردنی ژیان و گوزەرانی خەڵكی یەوە، هەر بە پارەو خێر و بێر و واریداتی ئەم وڵاتە خەڵكی ئەم وڵاتە بە تایبەت گەنج و لاوەكان بەرەو بێ دینایەتیی ببرێن و لە ئیسلام و قورئان و پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دوور وەخرێن!!

2- ئایا ژیان و گوزەرانی میللەتەكەمان چۆن بەرەو پێش دەچێ لە حاڵێكدا كە گەنج و لاوەكانمان بە كورِ و كچەوە لە جیاتی عیلم و صەنعەت و ئەدب و ڕەوشتی بەرز و جوان بۆ سەرخۆشیی و بێ هۆشیی و تێكەڵی و لاسایی كردنەوەی ئەملاولا هان دەدرێن؟! مەگەر میللەتان بە هۆشیاریی و ئاگایی بەرەو پێش چوون و دەچن، یان بە سەرخۆشیی و بێ هۆشیی و لاسایی كردنەوە؟!!

3- ئایا ئەو دروشم و شیعارە زریق و بریقانەی ڕێڕەوی عەلمانیی بەرزیان دەكاتەوە وەك: دادگەریی، دیموكراسی، مافی مرۆڤ، ئازادیی، كۆمەڵگای مەدەنیی... هتد، بە كردەوە بەرجەستەیان كردوون و دەكەن، یان زیاتر وەك كراسی

عوسمان و چاوپێچکێك بەکاریان دێنن؟!!

ئەگەر بۆ پراکتیزە کردنی ئەو دروشمانە کار دەکەن پێویستە ڕۆژ بۆ ڕۆژی قڕیی و پڕیی و ستەم و زۆر و هەموو شتێك بۆ حیزب قۆرخ کردن و نەفەس بە خەڵك تەنگ کردن و مافی مرۆڤ پێشێل کردن و... هتد، کەم ببێتەوە نەك بە پێچەوانەوە لە زیاد بوون دابێ و جەماوەر ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بێزارتر و تورەتر بێ و دڵساردتر و نائومێدتر بێ؟!!

4- ئایا کەسێك خۆی بە دڵسۆزی گەل و میللەتی بزانێ نابێ بەتەنگ دین و کلتوور و فەرهەنگ و ڕەوشتی یەوە بێ؟!

کەواتە نابێ خەڵکی دڵسۆز دژایەتی ئیسلام و ئەو کلتوور و فەرهەنگ و ڕەوشت و ئادابەی لێیەوە سەر چاوەی گرتوە بکات، چونکە لەگەڵ دەعوای دڵسۆزیی و بەتەنگەوە بوون دا یەك ناگرێتەوە؟!!

5- ئایا ئیسلام ومسوڵمانەتیی چ ڕێیەکی لە ئاوەدانیی وڵات و بەرەو پێش بردنی ژیان و گوزەرانی خەڵکی گرتوە؟! ئا یا یابانیی و چینیی یەکان ئێستاش لەگەڵ دا بێ هەر بت پەرست و (بوذا) پەرست نین لەگەڵ ئەوەش دا خەریکن لە

تەكنۆلۆژیای مەدەنیی دا پێش ئەورووپاو ئەمریكاش دەكەونەوە؟!

ئنجا ئەگەر بتپەرستیی وان ڕێ لە بەرەوپێش چوونیان نەگرێ، چۆن چۆنی خواپەرستیی ئێمەی مسوڵمان ڕێمان لێ دەگرێ لە حاڵێكدا كە بتپەرستیی نزمترین فیكرەو خواپەرستیی بەرزترین فیكرەیە؟!!

6- ئایا دەمڕاستانی ڕێڕەوی سیكۆلاریزم بیریان لەوە كردۆتەوە كە دژایەتیی كردنی ئیسلام و مسوڵمانەتیی و ڕەواج پێدانی بێدینایەتیی و بەرهەمە ژەهراوییەكانی، كە مەیخۆریی و قومار و بەرهەڵدایی و بێ دادی و داوێن پیسیی و ئاژاوە گێڕیی، هەندێكیانن، گەورەترین مەترسیی هەیە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی (الأمن القومي) میللەتەكەمان؟! چونكە بێگومان گەل و میللەتێك گەنج و لاوەكانی بە شێوەیەكی بەرهەڵدایی و بێ یاسایی بە غەریزەكانی خۆیەوە سەرگەرم كرابێ و خواو خەڵك و قیامەتی لە بیر برابێ، لە كاتی تەنگانە و لێقەوماندا و لە مەیدانی دیفاع و بەرگریی دا هیچ چاوەڕوانی یەكی لێ ناكرێ!!

كەواتە:

ئایا جێی خۆی نییە دەمڕاستانی ڕێڕەوی عەلمانییەت ئەگەر لەبەر خوا و خەڵكیش نەبێ هەر لەبەر خۆیان و، ئەگەر لەبەر دوارۆژ و دینیش نەبێ هەر لەبەر (ژین) یان، زیاتر هەوڵی تێگەیشتن لە ئیسلام بدەن و چی دیكە گەنج و لاوەكانمان بەدەردی كوشندەی لاسایی كردنەوەوە گرفتار نەكەن؟!!

21 ی جەمادی یەكەمی 1427 ك
17 ی حوزەیرانی 2006 ز
هەولێر

# دەقی وتـارەکــە

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ
الحمد لله رَّبِ العالَمين والصَّلاةُ والسلامُ عَلى النَبــيِّ الأمين محمدٍ المَبعوثِ لِلعالَمين والِه وَصَحبِه أجمَعين وَمَن إهتَدَى بِهَديِهم وَسارَ بِسيرَتِهم بِإِحسانٍ إلى يَومِ الدين

بەڕێزان و خۆشەویستان!

خۆشحاڵم بە دیداری هەموو لایەکتان لەم ئێوارە کۆڕەما ندا، ئەو بابەتەی کە بە پێویستم زانی پێشکە شی ئ ێوەی بەڕێزی بکەم، ناوونیشانەکەی بەو شێوەیەیە:

## (( گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا ))

هەموو لایەك دەزانین کە ئەمڕۆ میللەتی ئێمە لەم بە شەی کوردستاندا خوای پەروەردگار لە زۆر ڕووەوە دەرووی خ ێری لێکردۆتەوە و ئاوڕی بە خێری لێداوە تەوە، ئەوە بۆ هاوەی

پازدە(15)[6] ساڵێکە خوای بەخشەر کابووسی ڕەشی ڕژێمی بەعسی لەسەر سینگمان لابردووە، وە لە ولاتی خۆمان تا رادەیەك خاوەنی ئیرادە و ئیدارەی خۆمان بووین.

گومانیشی تێدا نییە کە ئایندە و داهاتووی هەر میلـلەتێك بەستراوەتەوە بە چینی گەنج و تازە پێگەیشتوویەوە و هەر میللەتێك گەنج و لاوەکانی ڕوو لە خێر بن دیارە ئەو میللەتەش ڕوو لە خێرەو ئەگەر خوا نەکردە گەنج و لاوەکانی ڕوو لە شەڕ بن دیارە ئەو میللەتە ڕوو لە شەڕ و نەهامەتیی و بێ خێریی یە، جا لە نێو میللەتی ئێمەش دا گەنجەکانمان -بە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ- وە، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین لە دوو حاڵەت دا دەبینین:

حاڵەتێك کە بەشێك لە گەنجەکانمان - بە کوڕ و کچەوە- بەرجەستەی دەکەن، کە بریتیە لە (ڕەسەنایەتیی)، وە دەیانەوێ پابەند بن بە ئیمان و عەقیدە و کلتوور و ڕابردووی ئیجابیی میللەتەکەیانەوە و چ شتێکی چاکی دیکەش هەیە لە خەڵکی دیکەی وەربگرن و بیخەنە سەر ئەو خاڵە ئیجابییانەی کە میللەتەکەیان لەوەو پێش لەسەریان بوون.

---

[6] لە ساڵی (1991) ەوە.

حاڵەتی دووەمیش بریتیە لە دیاردەیەك كە بەشێك لە گەنج و لاوەكانمان پێیەوە گیرۆدە بوون كە بریتیە لە (لاسایی كردنەوە) و كۆمەڵێك لە گەنج و لاوەكانمان ئەگەر سەرنجیان بدەی ئەوەیان لێ دەخوێنیتەوە، كە بڕیاریان دا بێ زەڕب (×) بە سەر ڕا بردووی خۆیاندا بێنن و ڕەگ و ڕیشەی ڕا بردووی خۆیان ب قرتێنن و جارێكی دی لە سفرەوە دەست پێ بكەنەوە!! كە بە تەئكید ئەو حاڵەت و دیاردەیە نەخۆشی یەكی ترسناك و كوشندەیە!

جا من لێرە بۆتان باسی ئەو دوو حاڵەت و دیاردەیە دەكەم بە شێوەیەكی تێكهەڵكێشی، وە هەوڵ دەدەم لە پێنج خاڵاندا بابەتەكەم كورت بكەمەوە كە ئەمانەن:

1- پێناسەی: گەنج، ڕەسەنایەتیی، لاسایی كردنەوە.
2- گرنگیی قۆناغی گەنجێتیی لە تەمەنی ئینساندا.
3- ڕەسەنایەتیی و بەهرە وەرگرتن لە خەڵك دوو شتی دژ بە یەك نین بەڵكو تەواوكەری یەكدین.
4- هۆكارەكانی پەیدا بوونی دیاردەی لا سایی كرد نەوە و تەشەنە كردنی لە نێو كۆمەڵگاكەماندا.
5- چارەسەری دیاردەی لاسایی كردنەوە.

## (1) پێناسەی گەنج و ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوە:

### یەکەم: پێناسەی گەنج:

بە کەسێك دەگوترێ گەنج کە لە سەرووی تەمەنی باڵغ بوونەوە بێ، هەندێکیش هەر لە قۆناغی هەرزەکاریی یەوە و شەی (گەنج)ی بۆ بەکاردێنن، تاکو قۆناغی پێش تەمەنی (40) چل ساڵی یان چەند ساڵێك دوای (40) ساڵیش.

جا ئینسانی گەنج، یاخود ئینسان لە تەمەنی لاوێتی یدا چەند تایبەتمەندیی یەکی هەیە کە کەمتر وایە ئەو تایبەتمەندیی یانە لە قۆناغەکانی دیکە دا هەبن:

1-یەکێك لەوانە بریتیە لەوەی کە ئینسانی گەنج زەینی ڕوونترەو توانای وەرگرتنی شتی تازە و بیر و باوەڕ و بۆچوون و زانیاریی تازەی زیاترە، جا چ بە باری شەڕ دا بێ چ بە باری خێر دا بێ، واتە گەنج زیاتر قابیلیەتی گۆڕانکاریی تێدایە.

2- یەکێکی دی لە تایبەتمەندیی یەکانی گەنج ئەوەیە کە گەنج ڕووحی پاکترە و بیرو هۆشی ئازادترە، چونکە جارێ پەروەردەو پەیوەندیی یە کۆمەڵایەتیی یەکان نەیان بەستۆتەوە ودەست و پێ یان گرێ نەداوە.

3- هەروەها گەنج ڕووح و گیانی فیداکاریی و خەباتکردنی زیاترە هەر بۆیەش ئەوانەی کە بەرگریی لە خاك و نیشتیمانی خۆیان دەکەن و بەرهەڵستیی دوژمن و داگیرکەر دەکەن بەزۆری لە چینی گەنجانن -شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە سەربازی کردن لە تافی گەنجێتی دایە-

4- یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندیی یەکانی گەنج ئەوەیە کە بوێریی و جورئەت و حەق بێژیی تێدا زیاترە، بەڵام ئەوە بە مانای ئەوە نییە کە دوای ئەوەی ئینسان دەکەوێتە تەمەنی کامڵ بوونەوە، ئەو تایبەتمەندیی یانەی تێدا نامێنن!! نەخێر بەڵام بێگومان ئەو تایبەتمەندیی یانە لە گەنج دا بە شێوەیەکی ئاشکراتر و زەقتر دیارن.

## دووەم: پێناسەی ڕەسەنایەتیی:

بە کورتی مەبەستمان لە ڕەسەنایەتیی ئەوەیەکە ئینسان پارێزگاریی بکات لە ڕابردووی خۆی، بە مەرجێك ڕابردوو شتێکی باش بێت، جا ئەگەر بیر و باوەڕێکی ڕاستت هەبووە، ئەگەر ڕەوشتێکی چاکت هەبووە، یاخود کلتوور و فەرهەنگ و چەند ئەدەب و نەریتێکی باشت بووە، یان ئەگەر کۆمەڵێك

سەروەریی باشت بووە لە مێژووتدا...هتد، ئەوانە پارێزگاریی لێ بکەی و شانازیی یان پێوە بکەی، کەواتە ڕەسەنایەتیی یانی: ڕێز گرتن لە شتە چاکەکان و سەروەریی یەکانی خۆت لە ڕابردوو دا و بەکەم تەماشایان نەکەی، جا بە تەئکید ڕەسەنایەتیی پێویستە بۆ هەر گەل و میللەتێك کە دەیەوێ بمێنێتەوە و بژی، چونکە هەر کەسێك شانازیی بە ڕابردووی خۆیەوە نەکات و هەر کەسێك ڕێز و تەقدیری نەبێت بۆ ڕابردووی خۆی و بۆ ئەو سەروەریی یانەی کە باب و باپیرانی تۆماریان کردوون، مانای وایە خۆی بێ ئەسڵ و بنچەکە و بێ ڕیشە دردێنێ، چونکە:

(هەر کەسێك دوێنێی نەبێ ئەمڕۆشی نابێ و، هەر کە سێکیش ئەمڕۆی نەبێ سبەینێشی نابێ)

## سێ یەم: پێناسەی لاسایی کردنەوە:

مەبەستمان لە لاسایی کرنەوە ئەوە نییە کە شتی چاك لە خەڵك وەربگرین، چونکە (تَقليد) لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبی یەو لە (قِلادَة) ەوە هاتوە، (قِلادَة) ش بەو ڕێشمەیە دەگوترێ کە خراوەتە ملی ئاژەڵ بۆ ئەوەی پێی ڕابکێشن، (قَـلَّدوه) یانی شتێکیان لە گەردن کرد (مُقَلِّد) یش، بە کەسێك دەگوترێ کە

قسە یاخود عادەت و کلتووری بابای لاسایی کراوەی کرۆتە ملی خۆی و بە کوێرانە و چاو نووقاوی بە دوای دەکەوێ.

کەواتە: لاسایی کردنەوە (تَقلید) شتێکی (مذموم) ە، هەر بۆیەش خوای گەورە لە چەند شوێنێك لە قورئانی بەرێزی خۆیدا ڕەخنەی گرتوە لەو کافر و بێ بڕوایانەی کە کاتێك پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بانگی حەقیان بە گوێ داداون، کافرەکان پاساویان بەوە هێناوەتەوە کە لەسەر ڕچەی باو باپیرانیان دەڕۆن بۆیە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرانی خوا ناکەن (علیهم الصلاة و السلام) وەك خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ: ﴿**بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّهْتَدُونَ**﴾ الزخرف -22-، واتە: بەڵکو کافرەکان گوتیان: ئێمە باب و باپیرانمان لە سەر ڕێچکەیەك بینیوە، وە ئێمەش هەر بە دوای شوێنەواری وان دا دەڕۆین.

خوای کاربەجێش بۆ پووچ کردنەوەی ئەو جۆرە مەنتیقە فەرموویەتی: ﴿**أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلاَ يَهْتَدُونَ**﴾ المائدة -104-، واتە: ئەدی ئەگەر هات و باب و باپیرانیان هیچیان نەزانیبێ و شارەزا نەبووبن - دەگونجێ هەر شوێنیان بکەون؟! -.

کەواتە: ئەتۆ دەبێ بە دوای پێشین و باب و باپیری خۆت بکەوی لە شتی باش دا، بەڵام لە شتی خراپ دا چ باب و باپیری خۆت چ هەر کەسێکی دیکە ئەگەر چاوی لێ بکەی و لاسایی بکەیەوە ئەوە لە ڕاستی دا ئەو هەڵوێست و ڕەفتارەت بریتیە لە جۆرێك لە بەجێ ماویی و متمانە بە خۆ نەکردن و خۆ دۆڕاندن و خۆ لەلا بێ بایەخ بوون! ئنجا لاسایی کردنەوە لە زۆر بواراندا بەرجەستە دەبێ:لە بواری فیکر و عەقیدە دا، لە بواری ئەخلاق و ڕەوشت و عادات و نەریت دا، لە بواری کۆمەڵایەتیی و سیاسی دا...

بۆیە هەر کەسێك یاخود هەر لایەنێك و کۆمەڵێك و میللەتێك بەبێ قەید و شەرت خۆی تەسلیمی کەسێك، لایەنێك، میللەتێکی کردەوە عادات و نەریتەکانی یان فیکر و بەرنامەکەی، یان ئەخلاق و ڕەوشتەکانی ئەوی وەرگرت، بەبێ ئەوەی لێی ورد بێتەوە و سەرنج بدا داخۆ چەندی بە کەڵك دێ و چەندی بە کەڵك نایەت، یان چەندی بۆ ئەو شیاوە بەڵام بۆ ئەم ناشێت!! ئەوە بەو کەسە یان لایەنە یان میللەتە دەگوترێ: لاسایی کەرەوە (مُقَلِّد) یاخود شوێن کەوتووی کوێرانە.

## (2) گرنگی قۆناغی گەنجێتی و لاوێتی:

شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە ئینسان لە تەمەنی لاوێتییی دا - وەك پێشتر ئاماژەم پێ کرد - کۆمەڵێك ئیمتیاز و سیفاتی هەیە یارمەتیی دەدەن تاکو بتوانێ سەرەتایەکی چاك یاخود خراپ بۆ کەسایەتیی (شخصية) خۆی دابڕێژێ، وە لەڕاستی دا ئەوانەی کە لە مێژووی بەشەرییەت دا بە باری خێر و چاکە دا یاخود بە باری شەڕ و خراپە دا گۆڕانکاریی یان کردوە، هەر لە چینی گەنجانەوە دەستیان پێ کردوە، بۆ نموونە:

شوێنکەوتوانی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بە زۆری گەنج بوون، هەروەها غەیری وانیش بە زۆری سوودیان لە چینی گەنج و تازە پێگەیشتوو بینیوە، وە لە ڕاستی دا تەمەنی گەنجێتی لە ژیانی ئینسان دا قۆناغێکە کە قۆناغەکانی دوایی تەمەنی پێوە پەیوەستن، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم یش لە یەکێك لە فەرمایشتەکانی دا لە بارەی گرنگیی قۆناغی گەنجێتی یەوە فەرموویەتی: **لا تَزولُ قَدَما عبدٍ يَومَ القيامَة حَتَّى يُسألَ عن أربعٍ: عَن شبابه فيمَ أفناهُ...** الترمذي 2341 واتە: دوو پێ یەکانی هیچ کەسێك لە ڕۆژی دوایی دا بەم لاو لا دا نا چێت تاکو پرسیاری لێ نەکرێ دەربارەی چوار شتان: یەکەم: لە بارەی

گەنجێتی یەوە -قۆناغی گەنجێتی خۆی- چۆنی بەڕێ کردوە؟!....

بەڵێ بە تەئکید قۆناغی گەنجێتی گەنجینەیەکە بەهۆیەوە ئینسان دەتوانێ کەسایەتیی یەکی وا بۆ خۆی دابڕێژێ، کە خزمەتی خۆی و خاك و میللەتی بکات، بۆیە ئینسان دەربارەی قۆناغی گەنجێتی بە تایبەت لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکرێ.

ئنجا وەك ئاماژەشم پێ کرد ئەو گۆڕانکاریی یانەی کە ڕوویان داوە هەم بە باری چاکە دا لەسەر دەستی پێغەمبەران ( علیهم الصلاة والسلام ) وە شوێن کەوتووانیان - کە چاك سازیی و پاکسازیی و گۆڕانکاریی ئیجابی بووە لە کۆمەڵگا دا- شوێن کەوتووانیان چینی گەنج بوون. هەروەها بە باری خراپە و سەلبیش دا دیسان شوێن کەوتووانی ئەهلی (با طل) یش کە گۆڕانکاریی خراپ و سەلبی یان کردوە، بە هەمان شێوە سوودیان لە چینی گەنج بینیوە، بۆیە هەموو لا یەکمان لە نێو کۆمەڵگا کەمان دا، زانا یان و دایکان و باوکان و...هتد، بەرپرسین لە بەرانبەر بە تەمەنی لاوێتیی کوڕ و کچەکانمان و نەوەکانمان و سەرجەم هاوولاتیان و دەبێ بە ئەمانەتێکی گەورەیان بزانین کە لە ئەستۆمان دان وە ئاگامان لێیان بێت، چونکە ئەگەر گەنج و لاوەکانمان مێشك و دڵ و دەروونیان بە

عەقیدەی ڕاست و بیری باش ڕۆشن بکرێتەوە و ئەخلاق و ڕەوشتێکی باشیان فێر بکرێ و لە سەر بەرنامەیەکی ڕاست و دروست پەروەردە بکرێن، لە ڕاستی دا دەبن بە ئەندامی زۆر کاریگەر وە دەبنە خشتێکی بە کەڵك لە بینای کۆمەڵگاکەمان دا، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر عەقیدەو فیکرێکی پووچ و عادەت و نەریتێکی خراپ و ڕەوشتێکی دزێو و هەڵس و کەوتێکی نزم فێر بکرێن و لەسەر سیاسەتێکی چەوت پەروەردە بکرێن ئەوە سەرەنجام دەبنە گیا کەڵە ومایەی دەردو نەهامەتیی بۆ خۆشیان و میللەتەکەشیان.

پێغەمبەری ئێمەش (علیه الصلاة والسلام) بەتەمەنترین هاوەڵی (أبوبکر الصدیق) خوای لێ ڕازی بێ بووە - وەك لە (سیرة إبن هاشم) و باقی کتێبەکانی دیکەی ژیانی پێغەمبەر دا هاتوە- کە ئەو کاتە تەمەنی (38) سی و هەشت ساڵ بووە کە مسوڵمان بوە، ئەوانی دیکەش هەموو لەو تەمەنیان کەمتر بووە، هەر چەندە خەڵکی دیکەش هەبووە کە لە دوایی دا مسوڵمان بووە و تەمەنی زیاتر بووە، بەڵام لە سەرەتاوە چینی گەنج و لاو لە خزمەت پێغەمبەر دا بوون علیه الصلاة والسلام، هەروەها هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) یش کە خوای کاربەجێ

بەسەرهاتەکەیانمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ﴿**إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى**﴾ الكهف -13- ، (فتية) کۆی (فتى) یەو (فتى) ش بە کەسێك دەگوترێ تەمەنی لە نێوان (15-20) یاخود (15-30) دایە، کەواتە: هاوەڵانی ئەشکەوت کە خوای پەنهانبین بەسەرهاتەکەیانمان بۆ باس دەکات کۆمەڵە گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوون کە ئامادە بوون لە کۆ مەڵگا و ڕژێمی طاغووتی یانەی خۆیان هەڵگەڕێنەوە و مل بۆ ناحەقی یەکانیان نەدەن و ئامادە نەبوون کۆیلایەتی بۆ ئینسانێك بکەن و، ژیانی نێو ئەشکەوتیان هەڵبژارد و پەسند کرد بەسەر ژیانی نێو کۆشك و تەلار دا، بە مەرجێك ئازادانە بژین و خاوەنی ئیرادەی خۆیان بن و بەندایەتیی بۆ خوا بکەن.

هەروەها زانستی دەروونناسیی و کۆمەڵناسیی ڕوونی کردۆتەوە ئینسان کاتێك لەسەر فیکرەو بیرو باوەڕێك چووە تەمەنەوە هەر لەسەری دەمێنێتەوە و کەمتر وایە دوایی دەستی لێ بەر بدات و بە زۆری وایە کە گۆڕانکاریی لە ژیانی ئینسان دا لە تەمەنی گەنجی دایە، پێش تەمەنی کامڵ بوون -کە زیاتر لە دەورو بەری (چل ساڵی) دا دەبێ. هەڵبەتە ئینسانی واش هەیە لە تەمەنی چل ساڵی و بگرە لە سەرووی شەست و حەفتاشەوە

جورئەت و بوێری وای هەیە کە گۆڕان بەسەر خۆی دا بێنێت، هەندێك لە زانا ئەورووپی یەکان لە تەمەنی زۆر هەڵکشیو دا کە خاوەنی بڕوانامەی زۆر بەرز بوون، مسوڵمان بوون! بەڵام ئەوە بە ڕێژەیەکی کەم ڕوو دەدات، چونکە بێگومان ئەوە کە ئینسان بتوانێ چاوپۆشی لەو ڕابردووەی خۆی بکات کە دەزانێ هەڵەیە و چاوپۆشی لە هەموو بەرژەوەندیی و دۆست و ڕەفیقانی خۆی بکات، کە لەسەر بیر و باوەڕێکی پووچ و ڕێگایەکی بەتاڵ بۆی پەیدا بوون، بە ڕاستی جورئەت و بوێری یەکی دەوێ کە لە هەموو کەس دا پەیدا نابێت.

## (3) ڕەسەنایەتیی و بەهرە لە خەڵك وەرگرتن دژی یەك نین:

بەڵێ ڕەسەنایەتیی و بەهرە لە خەڵکی وەرگرتن - با ئەو خەڵکە نامسوڵمانیش بن- دوو شتی پێکەوە دژ نین، بەڵکو بە پێچەوانەوە تەواوکەری یەکدین، جا ئێستا با تۆزێك تیشك بخەینە سەر مەسەلەی ڕەسەنایەتیی:

ئێمەی خەڵکی مسوڵمانی کوردستان ئەگەر بمانەوێ بە میللەتێکی ڕەسەن دابنرێین دەبێ پارێزگاریی لەو ئایین و بەرنامە حەق و ڕاستەی خوای کاربەجێ بکەین کە چەندان سەدەیە باب و

باپیران و پێشینانمان لەسەرینی و بۆتە هەوێنی مێژوو و هەناوی ئەدەب و فیكر و فەرهەنگ و كلتوورمان و دوایین نوسخەی هیدایەتی خوای بەخشەریشە بۆ مرۆڤایەتی و، تاكە كتێبێك كە ئێستا لەسەر دەستی بەشەر دا ماوەتەوە بە دەستكاریی نەكراویی و نەگۆڕاویی و مۆرنەشكاویی وەك چۆن خوای (تبارك و تعالى) ناردوویەتی، تەنها (قورئان) ە و بێجگە لەوی كتێبەكانی دیكەی خوای (عزَّوجلّ) هەموویان دەستكاریی كراون و گۆڕراون، حیكمەتی ئەو مەسەلەیەش ئەوەیە كە خوای كاربەجێ سەرجەم كتێب و پێغەمبەرانی دیكەی علیهم الصلاة والسلام هەر كامیان بۆ قۆناغ و هەل و مەرجێكی تایبەت و گەل و كۆمەڵگایەكی دیاریكراو ناردوون، بەڵام قورئانی بۆ تێكڕای مرۆڤایەتی ناردوە بە هەموو قۆناغ و هەل و مەرجە جیاجیایەكان و سەرجەم كۆمەڵگا جۆراوجۆرەكانەوە، هەتا ژیانی بەشەر لەسەر زەوی ماوە پێغەمبەرێكی دیكەی بۆ نایەت جگە لە محمد ﷺ وە كتێبێكی دیكەشی بۆ نایەت جگە لە قورئان، هەر بۆیەش خوای زانا و توانا بۆ خۆی قورئانی پاراستوە، بەڵام پاراستنی كتێبەكانی دیكەی عایدی زانایەكان كردبوو وەك لە بارەی (توراة) ەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا

**النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهداء...**﴾ المائدة -44-، واتە: ئێمە تەوراتمان ناردۆتە خوارێ ڕێنمایی و ڕووناکی تێدایە پێغەمبەرانی بۆ خوا ملکەچ وپێشەوا خوا پەرست و شارەزایەکان حوکمیان بەسەر جوولەکەکاندا پێ دەکرد، لە سۆنگەی ئەوەوە کە پاراستنی کتێبی خوایان پێ سپێررابوو وە بە سەریەوە چاودێر بوون...

وە لەو بارەشەوە کە پاراستنی قورئانی عایدی خۆی کردوە دەفەرموێ: ﴿**إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ**﴾ الحجر -9-، واتە: بێگومان خۆمان قورئانمان ناردۆتە خوار و بە تەئکید خۆشمان پارێزەرینی.

بێگومان شتێکیش خوای پەروەردگار بیپارێزێ سەلامەت دەبێ، بەڵام کاتێك پاراشتنی شتێك عایدی بە شەر دە کرێ دەگونجێ سەلامەت بێ و دەشگونجێ سەلامەت نەبێ. دەربارەی ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ و قورئان بۆ هەموو قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتی هاتوون خوا تبارك و تعالی دەفەرموێ: ﴿**وَ مَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ**﴾ الأنبياء -107-، واتە: وە تۆمان ڕەوانە نەکردوە مەگەر بەزەیی -خوا- بی بۆ سەرجەم جیهانی

یان، بەڵام لە بارەی پێغەمبەرانی دیکەوە (علیهم السلام) دەفەرموێ: ﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُوداً..... وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا... وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ الأعراف -65,73,85-، واتە: هەر کامێکیان بۆ قەومی خۆی هاتوە بەڵام پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بۆ هەموو میللەت و نەتەوەکان هاتوە بێ جیاوازی.

**پوختەی قسان:**

ڕەسەنایەتیی ئێمەی گەلی کوردی مسوڵمان بریتییە لە پارێزگاریی کردن لە دینەکەمان و لەو بەها بەرز و جوانانەی کە لێیەوە وەرگیراون، هەر لە خووڕەوشتە پەسندە شەخسییەکانەوە بگرە هاتە عادەت و نەریتە کۆمەلایەتی یەجوانەکان و...هتد، کە زۆربەیان خاڵی هاوبەشن لە نێوان تێکرای گەل و میللەتانی مسوڵمان دا و هەندێکیشیان تایبەتن بە گەلی کوردەوە بۆ نموونە: بەرگ و پۆشاك چ هی پیاوانە چ هی ئافرەتانە، کە بێگومان بەرگێکی جوان و بە ڕەونەقە و لەگەڵ کەش و مەناخی سروشتی کوردستانیش دا دەگونجێ، وەك چۆن جل و بەرگی هەر میللەتێکی دیکەش لە گەڵ کەش و ئاو و هەوای وڵاتەکەیان دا گونجاوە، پێشینانی ئێمەش کاتی خۆی بێ حیکمەت و بە

هەوەنتە ئەو جۆرە بەرگ و پۆشاکەیان دانەهێناوە و نەیانکردۆتە نەریتێکی نەتەوەیی خۆیان! جا پارێزگاریی[7] لە شتە باشەکانی خۆمان کە ڕەسەنایەتیی یە، لەگەڵ بەهرە وەرگرتن لە شتی چاکی خەڵکی دیکە دوو شتی پێکەوە دژ نین، یانی ئەو جۆرە بیر کردنەوەیە زۆر هەڵەیە کە پێی وایە ئێمە دەبێ ببینە عەلمانیی یان جوولەکە یان نەصرانی یان بوژایی ئەو کاتە دەتوانین لەو شتە باشانەی کە ئەوان هەیانە بەهرەمەند بین!! نەخێر چونکە (ئیسلام) تاکە دینی ڕاستی خوای بەرز و مەزن رێگەی هیچ شتێکی باشی لە ئێمە نەگرتوە، نەك هەر ڕێی لێ نەگرتوین بەڵکو لەسەریشی پێویست کردوین کە هەرچی شتی باشە لە خەڵکی دیکە وەری بگرین و لێیان بەهرەمەند بین.

بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ لە یەکێك لە فەرمایشتەکانی دا دەفەرموێ: **الحِكمَةُ ضَالَّةُ المؤمنِ أينَمَا وَجَدَها فَهُو أحَقُّ بِها** رواه الترمذي:2611 . واتە: زانیاری بە سوود و بە کەڵك شتێکە لە ئینسانی ئیماندار بزر بووە، لە هەر شوێنێك

[7] لێرەدا مەبەستم تەنیا تەنیا پارێزگاریی کردنە لە عادەت و نەریتی چاك و باش ئەگەر نا شتی خراپ نەك پارێزگاریی لێ کردنی پێویست نیە بگرە دروستیش نیەو پێویستە خۆشمانی لێ ڕزگار بکەین.

بیدۆزێتەوە لە هەموو کەس زیاتر بە شی پێیەوەیە. ئنجا پێغەمبەر ﷺ خۆیشی بە کردەوە ئەوەی ئەنجام داوە لە هەموو بوارەکانی: سیاسیی، ئیداریی، جەنگیی، فیکریی... هتد دا و هەر شتێکی چاکی لە گەل و میللەتانی دیکە -با کافریش بووبن- بینیی بێ و زانیبێ و بێ سێو دوو کردن لێی وەرگرتوون، بەبێ ئەوەی هەست بە هیچ حەرەجێك بکات، بۆ وێنە:

ئەو کاتەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ویستی نامە بۆ پادشاکانی: ڕۆم و فارس ومیصر وحەبەشە: (هِرَقْل) و (كِسْرى) و (مُقَوْقَس) و (نجّاشِي) بنووسێ بە مەبەستی بانگ کردنیان بۆ لای خوا و ئایین و بەرنامە ڕاستەکەی، یەکێك لە هاوەڵانی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پادشا و مەلیکەکان عادەتیان وایە نامەیەك ناخوێننەوە کە مۆر نەکرابێ و بە نامەیەکی ڕەسمیی نازانن!

ئەویش فەرمووی: مادام وایە مۆرێکم بۆ دروست بکەن لەسەری نووسرابێ (محمد رسول الله) بە شێوەیەك کە: وشەی (الله) لە سەرەوە بێ و (رسول) لە نێوەڕاست و (محمد) یش لە خوارێ، ئەوانیش مۆرەکەیان بۆ هەڵکەند، ئنجا هەر کاتێك نامەیەکی نووسیبایە ئەو مۆرەی لێدەدا و (ختم) ی دەکرد، وە

لەبەر ئەوەی یەکێك بووە لە عورفی سیاسیی خەڵك لەو ڕۆژگارەدا و ئێستاش هەر وایە، پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام نەی فەرمووە: نەخێر نابێ، چونکە ئەوە ناشەرعیی یەو لاسایی کردنەوەی کافرانی بێگانەیە!! یاخود لەکاتی جەنگی (خەندەق)دا سەلمانی فارسی خوا لێی ڕازی بێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئێمە لە وڵاتی فارس عادەتمان وابوو، ئەگەر لە خۆمان ترسابایین لەبەر زۆریی ژمارەی دوژمن، لەشار دا دەماینەوە و لەو شوێنانەی کە دەشتایی بوون و دوژمن دەیتوانی لێیانەوە بێتە نێو شار (خەندەك) مان هەڵدەکەند بۆ ئەوەی سوپای دوژمن نەتوانێ بیپەڕێتەوە، ئەویش (علیه الصلاة والسلام) یەکسەر دەفەرموێ: باشە، با خەندەك لێدەین.

هەروەها لە جەنگی (طائف) دا پێغەمبەر ﷺ سوودی بینی لە دوو ئامرازی جەنگی کە پێشتر بەکاری نەهێنابوون کە بریتی بوون لە (مەنجەنیق) و (دەبابە). هەروەها لە هەموو بوارەکانی دیکەش دا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) هەر کەسێك شتێکی باشی پێ بووبێ جا مسوڵمان بووبێ یاخود کافر، بەبێ هیچ مەناعەتێك وەری گرتوە لێی و بەهرەمەند بووە بۆ نموونە: پێشنیارەکەی (الحباب بن المنذر) لە جەنگی بەدر دا

وەك لە (سيرة إبن هاشم) دا هاتوه.

پاشان لە سەردەمی (عومەر) دا خوا لێی ڕازی بێ کە لە سەردەمی ئەو دا دەوڵەتی ئیسلامیی زۆر فراوان بوو کۆ هەڵێك تەرتیباتی ئیداریی لە دەوڵەتی فارس و ڕۆم وەر گرتن، وەك: دروست کردنی دیوانەکان -دیوانی سەربازان، دیوانی خەراج، دیوانی زەکات-، هەروەها داهێنانی حەپسخانە (سجن) کە لە سەردەمی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) و (أبوبكر) خوا لێی ڕازی بێ نەبوو، هەروەها هەر لە سەردەمی (عومەر) دا پۆستە (بريد) داهێنرا، کە پێشتر نەبوو، چونکە وادیارە پێشتر پێویست نەبووە.

هەروەها بە درێژایی تەمەنی سێزدە سەدەیی دەوڵەتی ئیسلامیی مسوڵمانان هەستیان بە هیچ سەغڵەتی یەك نەکردوە، لە وەرگرتنی شتی باش لە خەڵکانی دیکە لە هەموو بوارەکانی ژیان و گوزەران دا، بە مەرجێك لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیی دا دژ نەوەستابێ[8] و سوودو کەڵکی بووبێ بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی و کۆمەڵگای مسوڵمانان.

ئنجا ئێستاش کە دەبینین وڵاتانی ڕۆژئاوا - ئەمریکا و

(8) بێگومان شەریعەتیش لەگەڵ هیچ شتێکی باش و بە کەڵك دا دژ نیە و تێك ناگیرێ.

ئەوروپا- و هەندێك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتیش -وەك یابان و چین- لە بواری تەکنۆلۆژیا دا پێشکەوتوون، ئێمە ئەگەر چاو لەوان بکەین و لەوانەوە فێری داهێنان و پیشەسازی ببین و فێرببین کە چۆن وڵاتی خۆمان ئاوەدان بکەینەوە و...هتد، ئەوە نەك شتێکی خراپمان نەکردوە بەڵکو شتێکی زۆر باشیشمان کردوە و هەر ئەوەمان کردوە کە کاتی خۆی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام کردوویەتی.

کەواتە پێویستە هەموو لایەك ئەو حەقیقەتە بزانین کە پارێزگاریی لێکردنی ڕەسەنایەتی مان نەك هەر ڕێ لەگەمان لێ ناگرێ کە شتی چاك لە خەڵکی دیکە وەربگرین، بەڵکو ئەگەر تۆ بتەوێ پارێزگاریی لێ بکەی لە ڕەسەنایەتی خۆت دەبێ ئەو ڕەسەنایەتی یە موتووربە بکەی بە شتی چاکی دی کەی خەڵك، بەڵام بە مەرجێك لە چوارچێوەی ئەو شەریعەتە دابێ کە بناغەی ڕەسەنایەتی یەکەتە!

بۆ وێنە: با ئێمە لە هونەری پێشکەوتووی سینەما و شانۆی خەڵکی دیکە سوودمەند بین، بەڵام با نێوەڕۆك (محتوی) ی سینەما و شانۆی ئێمە (نێوەڕۆك) ێك بێ کە لەگەڵ ڕەسەنایەتیی ئێمە دا بگونجێ و لەگەڵ دین و عەقیدە و ئەخلاق و قیەمی ئێمە دا بگونجێ.

یاخود لەبواری ئەدەب و نووسین با بەهرە لە خەڵکی دی کە وەربگرین، بەڵام با وریابین نەکەوینە ژێر کاریگەریی نێوەڕۆکی ڕزیو و ژەهراویی بەرهەمەکانیان. بۆ نموونە:

(تۆلستۆی) چیرۆکی (ئەنناکارنینا) ی نووسیوە کە نێوەڕۆك و کاکڵەکەی بریتیە لەوەی کە، کابرایەك حەزی لە ژنی کابرا یەکی دیکە کردوە، ئنجا ئەو ئافرەتە خیانەت بە مێردە کەی خۆی دەکات و ئەویش بۆی تەڵاق دەدات نەوەك ژنە ناپاکە کە لە خەفەتان بمرێ!!

بەڵێ ئەوە جەوهەر و کاکڵی ئەو کتێبەی (تۆل ستۆی) ی ڕووسی یە کە دە ڵێن ئا کارێکی ئەدەبی زۆر بەرزە! بەڵام بێگومان کاکڵ و نێوەڕۆکەکەی هیچ نیە، پیسیی و زبڵە، جا با گەنجانی ئێمە، خەڵکی ئێمە ئیستیفادە لە (تۆل ستۆی) یان (شکسپیر) یان خەڵی دیکەی نووسەر و ئەدیبیان بکات، بەڵام نەك بەو نێوەڕۆکە ڕزیوە کە لە قیەمی ئاژەڵیی و مادیگەرایی و ئەوانەوە سەرچاوەی گرتوە، بەڵکو بە نێوەڕۆکێك کە لە ئیسلام و قورئان و سوننەت و بەها بەرزەکانیەوە سەرچاوە دەگرێ.

هەموو ئەوانە ئەگەر بۆ مەبەستێکی باش بەکار بێن و بۆ هێنانەدی ئامانجی شەرعیی بن و لە سنووری شەرع دابن. ئەوە

بە ڕاستی هیچ پێشگیریی (منع) یان لەسەر نیە، چونکە زانایانی ئیسلام بنچینەیەکی شەرعی یان داناوە دەڵێن: ((الأَصلُ في العِبادة المَنع والأصلُ في المعاملاتِ الأِباحة))، واتە: (بنا غەی مامەڵە کردن لە خوا پەرستی یەکا ندا ڕێنەدانە و بنا غەی مامەڵە کردن لەگەڵ هەڵس وکەوتەکان ڕێ پێدانە) واتە: تۆ بۆت نیە بە جۆرێك نوێژ بکەی و ڕۆژوو بگری غەیری ئەوەی کە شەرع دیاریی کردوە بەڵام لە بوار و مەیدانی هەڵس و کەوتی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و جەنگ و ئاشتی ڕێکخستنی ژیان لە ڕووی ئیداریی یەوە، ئەسڵ تێیدا دەست کراوە یی یە و دە بێ بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوەی کە ئەو شتە قەدەغەو ڕێ پێ نەدراوە ئەگەرنا لە ئەسڵ دا ڕەوا (مباح) یە و گرنگ ئەوە یە سوودی هەبێ و زیانی نەبێ.



## ( 4 ) دیاردەی لاسایی كردنەوە لە چی یەوە سەرچاوە دەگریٚ و هۆكارەكانی تەشەنەكردنی چین؟!

دیاردەی لاسایی كردنەوە جا چ لە تاكێك دا بێتەدی و چ لە كۆمەڵ و میللەتێك دا، لە باوەڕ بە خۆ نەبوون و متمانە بە خۆ نەبوونەوە سەرچاوە دەگریٚ، كاتێك ئینسان متمانە و باوەڕی بە خۆی و دین و كلتوور و فەرهەنگ و مێژووی خۆی و گەلەكەی نەبوو، سیاسەت و فیكر و فەلسەفە و عادەت و ئەخلاقی خەڵكی دی دەكاتە ڕێشمەیەك و لە گەردنی خۆی قایم دەكات و بە چاو نووقاوی بە دوای دا دەڕوات و خۆی تەسلیم دەكات!

دیارە كەسێكیش و كۆمەڵێكیش بەو جۆرە ڕەفتار دەكات، پەتی تەقلید لە گەردنی خۆی توند دەكات كە وا گومان دەبات و پێی وایە شایانی ئەوە نیە بە عەقڵی خۆی بیر بكاتەوە، بۆیە خۆی ناچار دەبینێ كە بە عەقڵی خەڵك بیر بكاتەوە! ئنجا بە تەئكید ئەگەر ئەو جۆرە ڕەفتارە لە هەموو كەس بوەشێتەوە، لە ئینسانی مسوڵمان و میللەتی مسوڵمان ناوەشێتەوە، چونكە مسوڵمان مێشك و دڵ و دەروونی بۆش و بەتاڵ و بێ بەرنامە نیە! بەڵكو هەموو شتێكی خۆی هەیە و ئایین و بەرنامە ڕاست و

دروست و لەگەڵ عەقڵ و فیطرەت و زانیاری دا گونجاو، کە پشتی دەرگای وەرگرتنی هەموو شتێکی چاکی بۆ خستۆتە سەر پشت و یەکالا کرۆتەوە! بۆیە کاتێك کوڕێك یان کچێك، خوشکێك ـیان برایەکمان یان کۆمەڵە گەنجێك دەبینین گیرۆدە بوون ـبە دە ست دەردی لاسایی کردنەوەی بێگانەوە چ لە بەرگ و پۆشاك دا چ لە بیر کردنەوە دا چ لە هەڵس وکەوت دا چ لە بێ بەند و ـباریی و عادەت و نەریتی خراپ دا بۆ وێنە:

بەکارهێنان و خووگرتن بەو جۆرە مادده سڕکەرانەوە ـکە ئینسان سەرخۆش دەکەن، بە هەموو جۆر و شێوەکانیانەوە: چ خوادنەوە بێ چ حەب خواردن چ دەرزی لە خۆدان....هتد.

ئەگەر پرسیار لە هەرچی زانای دەروونناس و کۆمەڵناس و تێکرای پزیشکەکان بکەین و بپرسین: ـکە ئا ـیا ـئەو شتانە چ قازانجێکیان هەیە؟! بێگومان هەموویان دەڵێن جگە لە زیان هیچ سوودێکی دیکەیان نیە!

دەی باشە بۆچی دەبێ خەڵکی ئێمە بەشێك لە گە نجەکانی ئێمە- لە خۆسەرخۆشکردن و خۆبێهۆشکردن دا لاسایی خەڵکی ئەورووپا بکەنەوە؟!

ئایا خەڵکی ئەورووپا ورۆژئاوا ئەوانەیان کە خۆ سەرخۆش و

بێ هۆش دەكەن، شار ستانێتی ئەوروپایان درو ست كردوە؟! بێگومان نەخێر، بەڵكو ئەو زانایانەیان شار ستانێتی یە كەیان بنیات ناوە كە لە هەوڵ و تێكۆشان دا شەو و ڕۆژان پێكەوە گرێ دەدەن، زانای وایان هەبووە تاكو بیردۆزەیەكی دۆزیوەتەوە، یان یاسایەكی خوای پەروەردگاری لە بوونەوەردا دۆزیوەتەوە، وا بووە كە چەند جارێك خواردنیان بۆ هێناوە نەیپرژاوەتەسەر ئەوە كە خواردنەكەی بخوات تاكو سارد بۆتەوە، بۆ ئەوەی زنجیرەی بیركردنەوە (سلسلة التفكر) ی نەپچڕێ! ئنجا گەیشتۆتە ئەو حەقیقەت و ڕاستی یە، بەڵێ وەنەبێ ئەو شارستانەتی یە ماددی یەی ئەمڕۆ خەڵكی سەرخۆش و بێ هۆش و بێ بەند و بار دروستیان كردبێ، هەتا گەنجەكانی ئێمە تەماشای وان بكەن!! بەڵكو وەك ئاماژەم پێ كرد ئەو زانایانە دروستیان كردوە كە هەوڵی بێ‌وچانیان داوەو زۆریان خۆ ماندوو كردوە، شارستانێتی و بەرەوپێشچوونە ماددی یەكەیان بەرهەمی كرد و كۆش و ڕەنج و ڕەحمەت و كۆمەڵێك ئاكاری پەسند و سیفەتی گەورە گەورەیە كە لە خەڵكی ڕۆژئاوادا هەن و ئەو ئاكار و سیفەتە باشانەیان وای كردوە كە ژیانی ماددی‌یان بەرەو پێش‌بچێ‌و ئەو شارستانەتی یە بێ ڕووحەیان وەدی بێ!

كەواتە: ئەوانەی كە دەیانەوێ تەماشای ڕۆژئاوا بكەن، با تەماشای شتە چاكەكانیان بكەن، كە دیارە ئەو كاتەش هەڵوێستەكەیان پێی ناگوترێ: (لاسایی كردنەوە) بەڵكو پێی دەگوترێ: (بەهرە وەرگرتن) چونكە لاسایی كردنەوە (تقلید) ئەوەیە كە تۆ بە چاك و خراپ بە دوای كابرا بكەوی بێ ئەوەی بزانی كە داخوا زەرەری لێ دەكەی یان قازانج!

## هۆکارەکانی تەشەنەکردنی دیاردەی لاسایی کردنەوە لە نێو کۆمەڵگاکەمان دا:

ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین کە لە کوردستانی خۆمان دا ماوەیەکە ڕۆژ بە ڕۆژ دیاردەی لاسایی کردنەوە، لە زۆربەی بوارەکانی ژیان و گوزەران دا، بە تایبەت لە نێو چینی تازە پێگەیشتوومان دا، تەشەنە دەکات کە بە تەئکید هیچ کەسێك ناتوانێ بڵێ ئەو لاسایی کردنەوە کوێرانەیە هیچ قازانج و سوود و کەڵکێکی هەیە!

بۆ نموونە: لە بارەی پەرەستاندنی دیاردەی پەنا بردنە بەر ماددە سەرخۆشکەرەکانەوە دەڵێین: بێگومان ئینسان بە عەقڵ و هۆش لە ئاژەڵ جیا دەبێتەوە، بۆیە ئینسانێك بە پارەی خۆی و بە دەستی خۆی ماددەیەك بخوات کە عەقڵی لەلا نەهێڵێت! ئایا ئەوە چ پێشکەوتنێکە؟!!

بێگومان خەڵکی ڕۆژئاوا بە عەقڵ و پێشکەوتن نەك بە بێ عەقڵی، بە هۆشەوە پێشکەوتن نەك بە بێ هۆشی! جا دەتوانین هۆی تەشەنەکردنی ئەو دیاردە[9]یە لە چوار خاڵاندا بخەینە ڕوو:

---

[9] واتە دیاردەی لاسا کردنەوەی کوێرانەی ڕۆژئاوا.

**یەكەم: هەبوونی لاسایی كردنەوە لە ئاستی باڵا دا.**

گەنج و لاوەكانمان لە سەروو خۆیانەوە حاڵەتی لاسایی كردنەوە دەبینن، چ لە بواری سیاسیی دا چ لە بواری فیكریی دا...هتد، تەماشا دەكەن ئەوانەی كە كار بەدەست و قسە ڕۆیشتوون زیاتر پەنا دەبەنە بەر بیر و سیاسەت و بیردۆزەی خەڵكی دیكە، بە بێ ئەوەی تەماشای دین و كلتوور و كەلەپووری میللەتەكەیان بكەن، كە ئایا چارەسەری كێشەو گرفتەكانی ئەو میللەتەی تێدایە یان نا؟!

بە ڕاستی زۆر جێی سەرسوڕمانە! كەسێكی ئاوا لە نێو میللەتێكی مسوڵمان دا نەزانێ قورئان و سوننەت چی یان تێدایە؟! بۆ ئەوەی كاتێك گوتی: ئیسلام چارەسەری دەردی ئێمەی پێ نیە! بە بەڵگەوە وا بڵێ!!.

جا من پێم وایە هۆكار و فاكتەری هەرە كاریگەری، تەشەنەكردنی دیاردەی لاسایی كردنەوە لە نێو گەنجەكان دا ئەوەیە كە تەماشای سەرەوەی خۆیان دەكەن و دەبینن لە سەرەوەی خۆیان دیاردەی لاسایی كردنەوە و دواكەوتنی خەڵكی دیكە زۆرە بێ ئەوەی كە باباى لاسایی كەرەوە ئاوڕ لە نێو ماڵی خۆی بداتەوە و بزانێ چی تێدایە؟!! وەك پەندە كوردی یە كە

دەڵێ: (ماڵیان پڕ بوو لە ڕازیانە منداڵیشیان بە زگ هێشەی دەمرد!!).

## دووەم: کاریگەریی سەلبی هۆیەکانی ڕاگەیاندن.

هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بەهەر سێ جۆری بینراو و بیسراو و خوێندراوەوە: کە بە ڕاستی لە راگەیاندنەکاندا زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکرێ کە گەنج و لاوی ئێمە سەرگەرم بکرێ بە قیەم و بیرو فەلسەفە و بۆچوونی خەڵکی دیکەوە! لە حاڵێك دا کە هەندێك لەو شتە باشانەی کە ئەوان دەیانەوێ بڵاوی بکەنەوە بە شێوەیەکی باشتر لە قورئان و سوننەتی خۆمان دا هەیە، وە بە تەئکید زۆرێکیش لەو بیرو بۆچوون و نەریتانە شتی تەپیو و ڕزیون و کێم و جەراحەتی برینەکانی خەڵکی ڕۆژئاوان و بە کەڵکی ئێمە نایەن و تەنانەت خۆشیان لێیان بێزارن!

بەڵێ بەڕاستی ڕاگەیاندنی سیکۆلاریستەکان بەگشتی دەوری یەکجار خراپیان هەیە لەو ڕووەوە.

ئنجا ئەوەی کە زۆر جێی سەرنجەو بگرە سەر سوڕمانە، ئەوەیە لە نێو میللەتێکی مسوڵمان دا - کە هیچ کەس بە قیادەی سیاسیشەوە نکوڵی نا کا لەوەی کە ئەو خەڵکە

مسولّمانە و هەمووشی ئیددیعای مسولّمانەتیی دەکات و خۆشی بە مسولّمان دەزانێ کەچی لە هۆیەکانی ڕاگەیاندنی هەموانیان بە بێ هەلاّواردن گو یێت لە ئا یەتێکی قور ئان یاخود فەرمایشتێکی پێغەمبەر نا بێ (علیه الصلاة والسلام) وە گوێبیستی ڕەواج پێدانی قیەمێکی ئیسلامیی نابیت! وەکو ئەوە ئیسلام هیچ شتێکی چاك و پەسندی تێدا نەبێ کە شایستەی باس کران بێت و لە ژیانمان دا بەس زەرەر و زیانمان کرد بێ لە ئیسلام!!

لە حالّێك دا ئێمە ئەگەر لە مێژووی ڕابردوومان دا خێر و خۆشی یەکمان دەست کەوتبێ و ناوێکمان چووبێتە نێو ناوانەوە و سەروەریی یەکمان تۆمار کردبێ، تەنها لە ژێر سایەی ئیسلام و لە باوەشی عەقیدە و فیکر و پەروەردەی ئیسلامیی دابووە چ لە ڕووی سیاسی، چ فیکریی و ئەدەبیی، چ زانستی... چ هەر ڕوویەکی دیکەوە.

وە لە ڕاستی دا ئێمە تەنها ئەوەمان هەیە کە لە سایە و لە باوەشی ئیسلام دا پەیدامان کردوە، تەنانەت ئەو میرنشینانەی کە مێژوو بۆی تۆمار کردووین وەك کیان و قەوارەی نەتەوەیی، وەك: میرنشینی ئەردەلاّن و سۆران و بابان و

بادینان و بۆتان...هتد، هەموویان لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا بوون! هەروەها لە هەر لایەن و بوارێکی ژیان و گوزەران دا سەرنجی مێژووی ڕابردووی گەلەکەمان بدەین، دەبینین کە بە هۆی ئیسلامەوە خێرێکمان پێ گەیشتوە و سەروەرییەکمان بۆ خۆمان تۆمار کردوە کەچی هۆیەکانی ڕاگەیاندنی قۆرخکراو بۆ بانگەشەی عەلمانییەت و لاسایی کردنەوەی بێگانە، هێندە بێ ویژدان و بوغزاویی و کین لە دڵن بەرانبەر بە ئیسلام!!

## سێیەم: هەبوونی بۆشایی فیکریی و ڕووحیی.

هۆکاری سێیەم بریتیە لە هەبوونی ئەو بۆشاییە لە دڵ و دەروونی بەشێك لەو گەنج و لاوانەمان دا کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی پڕو پاگەندەو بانگەشەی ناحەزانە و بیرەحمانەی ڕێڕەوی سیکۆلاریزم دژ بە ئیسلام، کە هەوڵ دەدات بە هیچ جۆرێك دانی خێر بە هیچ شتێکی ئیسلام دا نەنێ و باسی نەکات و ئەگەر گریمان باسیشی کرد لە ڕووی ڕەخنە لێ گرتن و توانج و پلار تێگرتنەوە باسی بکات!

ئیدی لە ئاکامی ئەو سیاسەتە چەوتەی سیکۆلاریستەکانەوە ژمارەیەك لە گەنج و لاوەکانمان بە هەردوو ڕەگەزیانەوە دووچاری

بۆشایی یەکی فیکریی و ڕووحی بوون و عەلمانی یەکان ڕێی ئیمان و ئیسلامیان لێ گرتوون و نە شیان توانیوە بەدیلێکی دیکەیان بدەنێ و وەك دەڵێ لە هەردووك دینان بوو ون!

ئیدی سەرەنجام ئەو سەرلێشێواوانە خۆیان ناچار بینیوە کە بەملاو لادا بگەڕێن و بسووڕێن بۆ پڕ کردنەوەی ئەو بۆشای یەی کە هەستی پێ دەکەن لە عەقڵ و دڵیان دا و، گیرۆدەی گەلێك بیر و بۆچوون و خوو و خدە و نەریت و هەڵ سوکەوتی پووچ و زیانبەخشی وا بوونە کە بێجگە لە (لاسایی کردنەوەی کوێرانە) هیچ پێناسەیەکی دیکە هەڵناگرن.

## چوارەم: بارودۆخی ناهەمواری سیاسیی و ئابووری و کۆمەڵایەتی.

ئنجا بێگومان بار و دۆخی نا هەموار و هەڵە و پەڵەی سیاسی و ستەم و زۆری ئابووریی و نا ڕێك و پێ کی کۆمەڵا یەتی گەلەکەشمان کە لە لایەن سیکۆلاریستانەوە هاتۆتە ئاراوە و فەرز کراوە، کاریگەریی سەلبی زۆری هەیە بۆ سەر چینی گەنج و لاومان، کە پەنا بەرنەبەر لا سایی کرد نەوە و چاو لێکرد نی کوێرانەی خەڵك، چونکە وەختێك گەنجێك بێ ئیشە و کاری

دەست ناکەوێ، یاخود تەماشا دەکا ئەوەی دوێنێ باسی چینی پرۆلیتار و خزمەتی خەڵك و میللەتی دەکرد، ئێستا کۆشکەکەی وێنەی نیە و لەبەر زۆری پارە و سامانی حیسابی خۆی نازانێ!! کەچی ئەویش خانووی دەست ناکەوێ و لە خانووی بە کرێ دایە! یاخود کاتێك دەبینێ باسی دیموکراسی دەکرێ، بەڵام حوکمێکی دیکتاتۆریی و عەسکەریی دەبینێ!! باسی حوکمی دەوڵەت و یاسا دەکرێ بەڵام حوکمی حیزب دەبینێ!! -هیوا دارین دوای یەکگرتنەوەی دوو ئیدارەکە ئەو دیاردانە بە یەکجاری بنبڕ بکرێن- بەڵێ گەنج کاتێك لە ئاوا هەل و مەرجێك دا دەژی، بێگومان ئەو هۆکارانەو چەندین هۆکاری سەلبی دیکە فشاری بۆ دێنن و چارەسەریشی دەست ناکەوێ بۆیە پەنا دەباتە بەر خۆ بێهۆشکردن و خۆ سەرخۆشکردن بە جۆرەها وەسیلە بۆ خۆ دزینەوە و ڕاکردن لەو واقیعەی کە تێیدا دەژی[10]!!.

---

[10] بەڵام گەنجی مسوڵمان و ئیماندار بەهۆی ئیمانەکەیەوە لەو دەردە و هەر دەرد و نەخۆشی یەکی دیکەی لەو بابەتە سەلامەت و پارێزراو دەبێ.

## ( 5 ) چارەسەرى كێشەى لاسايى كردنەوە لە چى دا دەبينين؟!

بەڕێزان!

من چارەسەر كردنى ئەو نەخۆشى و دياردە دزێوەى كە هەندێك لە گەنجەكانمان پێوەى گيرۆدە بوونە لە سێ خاڵان دا دەبينم:

**يەكەم: دەرك كردنى ئەو ڕاستى يە كە كلتوورى هەر گەل و كۆمەڵگايەك، هەڵقوڵاوى دين و عەقيدە و جيهانبينيى ئەو گەل و كۆمەڵگايەيە:-**

هەر ميللەتێك چۆن تەماشاى دين و ژين بكات و عەقيدە و بيروباوەڕى چۆن بێ ديارە كلتوورەكەيشى وا دەبێ، بۆيە زۆر هەڵەيە كە ئێمە بانگەشە بكەين بۆ كلتوور (ثقافة) ى خەڵكى دى كە هەڵقوڵاوى دين و عەقيدە و جيهانبينيى خۆيانە، هەڵبەتە مسوڵمان سەلبى و داخراو نيە لە بەرانبەر فيكر و كلتوورى خەڵكى ديكەدا ،بەڵام لاسايى كەرەوە و خۆبەدەستەوەدەريش نيە، وەك خوا فەرموويەتى: ﴿ **الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُوْلَئِكَ هُمْ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ** ﴾ الزمر -18-،

واتە: ئەوانەی کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن بەڵام بە دوای چاکەکەی دەکەون ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون وە ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

بەڵێ مسوڵمان نابێ وەك سەبەتە بێ هەرچی تێکەی هەر وەری بگرێ و هەڵی گرێ! بەڵکو دەبێ بێژینگ بێ و شتی باشی خەڵك وەربگرێ و خراپەکەشی فڕێ بدات، ئێمەی مسوڵمان خاوەنی فیکرو ئەدەب و کلتووری خۆمانین کە لە دین و عەقیدە و جیهانبینیی خۆمانەوە هەڵقوڵیوە، بە هەمان شێوە خەڵکی دیکەش خاوەنی کلتوور و ئەدەبی خۆیەتی کە پەیوەندیی بە دین و عەقیدە و جیهانبینیی خۆیەوە هەیە، ئیدی مەرج نیە ئەو فیکر و کلتوورەی ئەوان بە کەڵکی ئێمە بێت، بۆ نموونە:

مەرج نیە عەلمانییەت (سیکۆلاریزم) -کە لە ئەوروپا پەیدا بووە- بە کەڵکی ئێمە بێت، ئەوروپا بۆیە پەنای بردە بەر عەلمانییەت چونکە دینێکی ئەفسانەیی و تێکدراوی لەبەر دەست دا بوو، دینێك کە لەسەر بناغەی وی قەشە و پاپایەکان دەستیان لەگەڵ پاشا و دەرەبەگەکاندا تێکەڵ کردبوو، وە بە هەرسێك لایان سێکوچکەیان پێکهێنابوو (قەشە، دەرەبەگ، پادشا) ئەو سێکوچکە شوومەی دژی بەرژەوەندی یەکانی خەڵك و جەماوەر

بوو، بۆیە خەڵك بە قیادەی زانایان و فەیلەسووفەکان لەو دینە و دام و دەزگاکانی ئەو دینە ڕاپەڕین، کەواتە ئەو عەلمانی یەت و بێدینایەتی یەی کە لەوێ سەری هەڵداوە هیچ پەیوەندی یەکی بە ئێمەوە نیە، چونکە دینی ئێمە بە پێ چەوانەی نە صرانییەتەوە دژی زوڵم و ستەمی ئابووری یەو دژی ئیستیبدادی سیاسی یەو دژی تەقلید و لاسایی کردنەوەی کوێرانە یە و لە گەڵ عیلم و عەقڵ دایە و لەگەڵ برایەتی و تەبایی دا یە و بە کورتی دژی هەموو شتێکی خراپەو لەگەڵ هەموو شتێکی باش دایە، کەواتە بەشێکی بنەڕەتی لە کلتووری ئەورووپا کە بریتیە لە عەلمانییەت و لە هەل و مەرجی تایبەتی وڵاتانی ڕۆژئاوا هەڵقوڵیوە مەرج نیە بە کەڵکی ئێمە و ئێرە بێت، وە بێگومان ئێمە وەك خەڵکێکی مسوڵمان هیچ پەیوەندیمان بە عەلمانییەتەوە نیە و هیچ پێویستیشمان پێی نیە و بە تەئکید عەلمانی یەت ئە گەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بگونجێ بە زەبری پارە و ترس و تەماع و چەواشەکاریی و بێ ئا گایی خەڵکەوە بژیەت، ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر بمێنێ، وەك چۆن کاتی خۆی لە سەرەتای هەشتایەکان بە وانەی کە هەڵگری فیکرەی مارکسیزم و کۆمۆنیزم بوون پێم دەگوتن:

کاکە فیکرەی مارکسیزم و کۆمۆنیزم لێرەدا ناڕوێ! میللەتی ئێمە دینێکی ڕاست و تەواو و دروستی هەیە و مارکسیزم و کۆمۆنیزم کاتی خۆی لە کاردانەوەی زوڵم و ستەمی ڕژێمی سەرمایەداریی دا پەیدا بووە، بەڵام ئیسلام لە کاردانەوەی هیچ شتێك دا پەیدا نەبووە، بەڵکو بەرنامەیە کە و خوای پەروەردگار دایبەزاندوە و پەیوەندیی بە جیهانبینی و بە عەقیدەوە هەیە، بە عیبادەت و بە ئەخلاقەوە، بە حوکم و سیاسەتەوە، بە ئابووریی و لایەنی کۆمەلایەتییەوە هەیە و حەقیقەتێکی ڕەها (مطلق) ی خواییە دایبەزاندوە بۆ ڕێکخستنی ژیانی خەڵك، بەڵێ دەرك کردنی ئەم ڕاستییە یەکەم هەنگاوی چارەسەرە، کە ئێمە میللەتی مسوڵمانی کوردستان دەبێ کلتوور و فەرهەنگ و سیاسەت و حوکم و ڕەوشت و هەلس و کەوت و... هتدمان هەڵقولاوی دین و عەقیدەی ئیسلامیی مان بێت، نەك شتێکی دیکە چونکە بە پێچەوانەوە وێڕای ناشەرعیی و بێ دینی، دووچاری حاڵەتێکی سەیر و سەمەرەو نامەنتیقیش دەبین کە بە هیچ پینەو پەڕۆیەك پاساو نادرێتەوە!

## دووەم: بـاوەڕ و متمـــانە هـــەبوون بە ڕەســـەنایەتیی خۆمان:

ئەمیش دووەم هۆکاری گرنگە بۆ چارە سەر کرد نی ئەو نەخۆشی و دیاردەیەیە، بەڵێ دەبێ ئێمە باوەڕ (ثـقة) مان بە خۆمان بێت کە خاوەنی ڕابردوویێکین وئێمە درەختێکی بێ ڕەگ و ڕیشە نین و میللەتێکی بێ مێژوو نین، ئێمە میللەتێك نین بێ سەروەری بین، ئێمە دەیان ڕابەر و سەرکردەمان هەیە لە مەیدانی خەباتی ڕزگاریخوازی دا کە لە سەرکردە و ڕابەرانی گەلانی دیکە کەمتر نین، وە لە مێژووی ئیسلامدا کەڵە پیاوی وامان هەبووە بۆ نموونە: (صلاح الدین) کە نەك هەر کورد و گەلانی مـ سوڵمان بەڵکو مرۆڤایەتی شانازیی پێوە دەکات.

هەروەها لە ڕووی زانست و فەرهەنگ و ئەدەبەوە خاوەنی کەڵە پیاوی گەورە گەورەین، بە هەمان شێوە لە ڕووی تەزکـیەی نەفسەوە خاوەنی پێشەوا و زانایانی زۆر بەرجەستەین کە خەڵکی دیکەش لەسەر دەستیان هیدا یەتی وەرگر توە، کەوا تە ئێ مە خاوەنی دیـ ێك نین ڕابردوو یەکی پڕ شنگدار و مێژوو یەکی شکۆمەندی جێی شانازیی بۆ نەڕەخساندبین، تاکو قێز مان لە خۆمان ببێتەوە و خەت بەسەر ڕابردووی خۆمان دا بـ هێنین!! بۆ وێنە: لە ڕووی ئەدەب و شیعرەوە خاوەنی چەندین شاعیری گەورەو

هەڵکەوتووین، وەك: (نالی، مەحوی، ئەحمەد شەوقی، مەلای گەورە، مەلای جەزیری، حاجی قادری کۆیی، ئەحمەدی خانی...هتد)، وە لە بواری تەزکیە و تەسەوف دا خاوەنی پیاوی وەك: (مەولانا خالید و کاك ئەحمەدی شێخ و شێخ عثمانی تەوێڵەیی و شێخ یوسفی بورهان و...هتد) ین، وە لە ڕووی خەباتی نەتەوایەتی یەوە خاوەنی کەڵە پیاوانی وەك: (شێخ مەحمودی حەفید، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، شێخ سەعیدی پیران، قازی محمد، سمایل خانی شکاك، مەلا مصطفی بارزانی) ین کە پیاوی بە شەهامەت و جوامێرو بەرجەستە بوون و توانیویانە بەشێکی زۆری میللەتەکەی خۆیان قەناعەت پێ بێنن کە خەبات بکەن، لە پێناوی ئازادیی و ڕزگاریی دا.

بەڵێ، ئێمە میللەتێکی بێ ڕابردوو و بێمێژوو نین تاکو خۆمان وەك کەسێکی بێ ڕابردوو و بێ مێژوو بێتە بەرچاو و هیچ باوەڕو متمانەیەکمان بە خۆمان نەبێت، کەواتە: هەنگاوی دووەم بۆ چارەسەری کێشەی لاسایی کردنەوە و پەرەپێدانی دیاردەی بەهرە وەرگرتن لە خەڵك لەسەر بنەمای ڕەسەنایەتی، بریتیە لە متمانەو باوەڕ بە خۆبوون، بە دین و عەقیدە و کلتوور و مێژوو و...هتدی خۆمان.

## سێیەم: هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی کێشەوگرفتەکانی کۆمەڵگاکەمان:

-وەك ئاماژەم پێ کرد- سوپاس بۆ خوا ئاواتێکی چەندین ساڵەمان هاتەدی کە ئەویش بریتی بوو لە یەکگرتنەوەی دوو ئیدارەکە کە ئومێدێکی خستۆتە دڵی خەڵکەوە و هیواداریین کە ئەو حکوومەتە یەکگرتووەی کوردستان بتوانێ ئەو قەیرانانە چارەسەر بکات لە هەموو ڕوویێکەوە، قەیرانی ئابوریی و سیاسی و کۆمەلآیەتی و کلتووریی و ئەخلاقی... کە بێگومان ئێمە لە هەموو ئەو بوارانەدا لە قەیران داین ئنجا دیارە ئەو قەیرانە جۆراوجۆرانەش فشارێکی زۆر دەخەنە سەر دڵ و مێشکی بەشێك لە گەنجەکانمان و وایان لێ دەکەن کە بیر لە شتی سەیر و سەمەرە بکەنەوە کە وەك گوتمان مەگەر ناوونیشانی: ((**لاسایی کردنەوە و کوێرانە بە ڕێ دا ڕۆیشتن**)) بگونجێ بکرێتە پێناسەیان.

ئیدی بە هیوای ئەوە کە بە هەوڵ و هیممەت و هاوکاری هەموو لایەك بتوانین چارەسەری ئەو دیاردە و نەخۆشییە کوشندەیە بکەین لەبەر ڕۆشنایی ئەو سێ ڕاستی یەدا کە باسمان کردن:

1- فیکر و کلتوور و فەرهەنگی ئێمە پێویستە لە دین و

عەقیدە و جیهانبینی ئیسلامیی مانەوە هەڵبقوڵێ.

2- دەبێ باوەڕ و متمانەمان بە ڕابردووی خۆمان هەبێ.

3- هەوڵی چارە سەر کردنی کێشە و قەیرانە گەورە و جۆراوجۆرەکانمان بدەین هەموو لایەکمان بە گشتی و بە تایبەت برادەرانی عەلمانیی حوکمڕان کە هەر چی دەسەڵات و سامانە لای ئەوانە!.

تاکو خەڵکەکەمان بە گشتی و گەنج ولاوەکانمان بە تایبەت کە هەستیارترین چین و توێژی هەر گەل و کۆمەڵگایەکن لە ژێر فشاری ئەو واقیع و هەل و مەرجە تاڵ و دژوارەدا زیاتر تووشی نا ئومێدیی نەبن و پەنا بۆ شتی وا نەبەن کە پێچەوانەو دژی دین و عەقڵ و مەنتیق و بەرژەوەندیی دنیاو دوا ڕۆژیانە!

سبحانَك اللّٰهُم وبحمدك أشهد أن لا اله إلا أنت
أستغفرك وأتوب إليك

# نێــوەڕۆك